ئەستێرەناسی

# جیهانی مانگ



## محمد لطیف



دیاری کردنی ساڵنامەی ...

رەگەزی دڵخواز کوڕ یان کچ؟!
هەڵبژێرە!

# جیهانی مانگ

نوسینی
محمد
لطیف محمد صالح
خوێندکاری ئامادەیی چەمچەماڵ

ڕێبەندان- ٢٧٠٣.کوردی

نـــاوی کتێب : جیهانی مانگ

ناوی نووسەر : محمد لطیف محمد صالح

بـــابـــەت : ئەستێرەناسی

تیراژ:( ٥٠٠ ) دانە

ژمارەی سپاردن : ( ٤٣٧ ) ی ٢٠٠٣ وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی کوردستانی دراوەتی

# ناوەرۆك

## پێشکەشە :-

- بە سەرجەم هاوڕێ دڵسۆزەکانم.
- بە هەموو ئەوانەی تەنها پیتێکیان فێرکردووم.
- بەو کەسانەی ترووسکایی نورو ڕوناکی زانست لە دڵیاندا دەبینرێ بە وێنەی مانگ لە ئاسمانی بەریندا.

## بسم الله الرحمن الرحيم

(( هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْس ضِيَاءً وَالقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالحِسَابَ مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَلِكَ إِلَّا بِالحَقِّ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ) )( يونس:٥ )

(( اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ القَمَرُ )) ( القمر:١ )

(( يَسْأَلُ أَيَّانَ يَوْمُ القِيَامَةِ ﴿﴾فَإِذَا بَرِقَ البَصَرُ ﴿﴾وَخَسَفَ القَمَرُ ﴿﴾وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالقَمَرُ )) ( القيامة:٦-٩ )

(( تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجاً وَقَمَراً مُنِيراً )) ( الفرقان:٦١ )

(( فَلا أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ ) ﴿﴾وَاللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴿﴾وَالقَمَرِ إِذَا اتَّسَقَ ﴿﴾لَتَرْكَبُنَّ طَبَقاً عَنْ طَبَقٍ )) ( الانشقاق:١٦-١٩ )

(( وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْس وَالقَمَرَ وَالنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ )) ( النحل:١٢ )

# بەرایی

خوێنەری هێژا...

ئەوەی گومان لە خۆ ناگرێ و ڕوون و ئاشکرایە ئەو ڕاستی‌یەیە کە ئەستێرەناسی لە چاو زانستەکانی تردا هێند لە مێژە مرۆڤ گرنگی پێداوە کە دەتوانین لەم ڕووەوە بە دایکی زانستەکانی ناودێربکەین و ئەگەر چاوێکیش بە فەرهەنگی زۆرێك لە میللەتاندا بگێرین دەبینین چەند بە جوانی و درەخشانی ڕەنگی داوەتەوەو چ ڕۆڵێکی گێڕاوە لە ژیانی ئەو سەردەمانەدا.

زانستخوازی ئازیز ، ئەو بابەتەی بەردەستت تەنها لە کوچەیەکی بچوکە وە ڕۆچوونە بە ناو ئەو جیهانە فراوان و پڕ تەلیسمەدا کە چەندین کەڵە زانای ئەستێرەناسی نوقمی خەیاڵ و بیرکردنەوەی سەیرو گێژو سەرسوڕمان کردوە ئەو بەشەی یان جیهانەی من لێرەدا تۆسکاڵێ لەسەری ڕادەمێنم و هەوڵەدەم شتێك ئەگەر بچوکیش بێ لەسەری بە هەڵبزرکاوی بجووم، جیهانە پڕ ڕازەکەی مانگ(( هەیڤ ))ە.

مانگ هێندە جێگای گرنگی و بایەخی مرۆڤ بووە لە کۆن و بگرە ئێستاش دا کە جگە لەوەی یەکێ لە خواوەندەکانی زۆربەی میللەتانی کۆن مانگ بووە و پەرستوویانە لە ئەفسانەکانیش دا لە چەندین شوێن و بە چەندان جۆرو هەمەچەشنە باسی لێکراوە و ئەفسانەو شتی سەیر سەیریشی لە سەر وتراوە

هەروەها ئێستاش دەبینین کە هەریەکە لە((مانگ و خۆر))سـاڵنامەو ڕۆژمێـری تایبەتی خۆیان هەیەو خەڵکی کاتی خۆیانی پێ ڕێك دەخەن.

ئەبێ ئەوەش بڵێین کە چەندین زاناو ئەستێرەناس هەن پێیان وایـە مـانگ بووەتە هۆی لافاوە گەورەکەی جیهان و بە هۆی نزیك بوونەوەی مـانگ لـە زەوی یەوە و هێزی کێش کردنی مانگەوە ئاوی سەر ڕووی زەوی لە ئاسـتی دیـاریکراوی خۆی بەرزبۆتەوەو ئەو کارەساتە سروشتی‌یەی لێکەوتۆتـەوە ،ئەمـەو زۆربـەی ئەفســانەکانی میللــەتانی کــۆنیش هــەمان شــت دووبــارە دەکەنــەوە ،((ئەلکسگۆراس))ی ئەستێرە ناسی یۆنانیش لە سـەدەی پێنجـەمی ((پ.ز))دا وتوویەتی: -((مانگ زۆر پاش دروستبوونی زەوی لە ئاسماندا پەیدا بـووە)) ،هەروەها یۆنانی یە کۆنەکانیش بە گەلی ((ئەرکادی))یان وتووە((گەلی پێش مانگ)) ؛ و لە زۆر ئەفسانەی میللەتاندا دەر دەکەوێ کـە مـانگ لـە ئاسمانـدا نەبووە لە پێش لافاودا

بەم جۆرە مانگ تا ئێستاش چەندین لێکۆڵینـەوەی هەمـە جـۆری لەسـەر دەکرێو کراوەو سەرنج و هەستی زۆر لە زانایـان و ئەسـتێرە ناسـانی بـۆ خـۆی داگیرکردووە ئەوەی من لـەم بابەتـەدا هـەوڵی چـڕکردنەوەیم داوەو تەقـەلاَم کردووە گوزارشتی لێ بکەم دەربارەی مانگ بەشێکە لە ئەستێرە ناسی و مەبەستم بووە بە ووردی بەرنامەیەکی گشـتی شـوێنەکانی مـانگ و ڕۆژمێـرو سـاڵنامەی مانگی دیاری بکەم و چەند بایەخ و سودێکی بخەمە بەردەست،بە هیوای ئـەوەی خوێنەریش بتوانێت بە سەرنجەوە لـە سـەرجەم بابەتەکـە بڕوانێـت و هـەموو بەشەکانی پێکەوە پەیوەسـت بکـات،چـونکە لـە ڕاسـتی‌دا سـەرجەمیان یـەك

بابەتن.وە بە پێچەوانەی ئەوانەی کە پێیان وایە ساڵنامەو ڕۆژمێری مانگی ناتوانرێ بە جێگیری دیاری بکرێت،من پێم وایە ئەگەر نەتوانرایە نەشدەکرا کاتی مانگ گیران و خۆر گیران هێندە بە وردی دەستنیشان بکرێ وەك ئەوەی بینیمان هەروەها خوێنەر دەتوانێت تەماشای کاتەکانی نوێبوونەوەی مانگ بکات لە بابەتەکەداو سەرنج لە مانگیش بدات و بزانێ زۆر بە ڕێکی لەیەك کاتدا نوێ دەبنەوە یان نا.

پێویستە ئەوەش بوترێ لە سەر ڕەگەزی کۆرپەلە کە بۆ خۆم چەندین ئەزموون و تاقی کردنەوەم لە گەڵیدا هەیەو پاشان بڕیاری یەکلایی کەرەوەم لەسەر داوە ئیتر تۆش سەرپشك بە.

ماوەتەوە بڵێین کە ئەگەر ویستت شوێنەکانی مانگ لە بەرنامەکەدا چەند پلەیەك بگۆریت لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر پێویستت بەوەیە بزانی مانگ لە ماوەی((١))یەك کاژێرو((٤٧))خولەك و ((٤٣))چرکەدا یەك پلە دەبڕێ لە کۆی ((٣٦٥,٢٤٢١٩٨))پلە.

ئیتر بە هیوام بتوانم سیمایەکی جوانی ئەستێرە ناسی بە گشتی و نوری مانگتان بە تایبەتی پێ ببەخشم.

محمد لطیف محمد صالح

گەلاڕێزانی/٢٧٠١

# مانگ (( هەیڤ ))

مانگ نزیکترین تەنی ئاسمانی‌یە لەزەوی یەوە هەربۆیە قەبارەکەشی واگەورەدیارە لەچاو هەسارەو ئەستێرەکانی تردا • مرۆڤ هەر لە زووەوە لەمانگی کۆڵیوەتەوە • لەساڵی ((١٩٦٩ ز.)) دابۆ یەکەمجار مرۆڤ دابەزی‌یە سەرمانگ • دوای ئەمەش هەنگاوی گەورەتر نراوە بۆ لێکۆڵینەوەلەسەری مانگ تەنێکی خڕو ڕەق و ساردو بێ ئتشکە • بەشێکی

ئەو ڕوناکی یەی دەکەوێتە سەری لەخۆرەوە ئەیداتەوە • تیرەکەی نزیکەی ((٣٤٧٦کم)) ە • پلەی گەرمی‌سەر ڕووی زۆر گۆڕاوە • ماوەی نێوان مانگ و زەوی نزیکەی ((٣٥٦–٤٠٥ )) هەزار کیلۆ مەترە • سەر ڕووی مانگ چاڵ و چۆڵی و کێو و دۆڵێکی زۆری تێدایە هێزی کێشکردن لەسەر ی ((١/٦ )) ی هێزی کێشکردنی زەوی‌یە • لەماوەی مانگێکی ((مانگی–کۆچی ))دا سوڕێکی تەواو دەکات بەدەوری زەوی‌دا کە دەکاتە

((٢٩,٥٣٠٥٨٨٩١٦٦٦٦٦))ڕۆژ واتە ((٢٩)) ڕۆژ و ((١٢)) کاژێر و ((٤٤)) خولەك و ((٢,٨٨)) چرکە[1]. بەلآم بەدەوری بازنەی خەیالی ((زۆدیاك )) دا بەماوەی ((٢٧,٣٢١٥٨٢٣٤٢)) ڕۆژ واتە ((٢٧)) ڕۆژ و ((٧)) کاژێر و ((٤٣ ))خولەك و ((٤,٧)) چرکە[2] سوڕێکی تەواو دەخوات.

---

[1] ٢٩,٥٣٠٥٨٨٩١٦٦٦٦٦-٢٩=٢٩ڕۆژ و ، ٠,٥٣٠٥٨٨٩١٦٦٦٦٦×٢٤کاژێر=١٢,٧٣٤١٣٤کاژێر، ٠,٧٣٤١٣٤کاژێر ×٦٠خولەك=٤٤,٠٤٨٠٤خولەك، ٠,٠٤٨٠٤خولەك×٦٠چرکە=٢,٨٨٢٤چرکە

[2] لە ماوەی ٢٩,٥٣٠٥٨٨٩١٦٦٦٦٦ڕۆژدا،مانگ((٣٦٥,٢٤٢١٩٨))+((٢٩,٥٣٠٥٨٨٩١٦٦٦٦٦))کە دەکاتە ((٣٩٤,٧٧٢٧٨٦٩١٦٦٦٦٦))پلە ئەبڕێ،ئەی لە ماوەی چەندا ((٣٦٥,٢٤٢١٩٨))پلە ئەبڕێ؟ ٣٩٤,٧٧٢٧٨٦٩١٦٦٦٦٦/٢٩,٥٣٠٥٨٨٩١٦٦٦٦٦=٣٦٥,٢٤٢١٩٨/ماوەی سوڕێکی زۆدیاك.

ماوەی سوڕێکی زۆدیاك=٣٦٥,٢٤٢١٩٨

٢٩,٥٣٠٥٨٨٩١٦٦٦٦٦/٣٩٤,٧٧٢٧٨٦٩١٦٦٦٦٦=٢٧,٣٢١٥٨٢٣٤٢ڕۆژ



بڕواناکەم کەسێ هەبێ مانگی درەوشاوەی بوکی ئاسمان هەستی بەکێش نەکردبێ و سەرنجی ڕانەکێشابێ ، شاعیران ڕوو یان تێکردووە و بەبوزورکی جوانی یان لەقەڵەم داوە ، منیش بۆ خۆم کەوتوومە داوی عە شقی‌یەوە .....!

لەکۆندا مانگیان بەخواوەند ناسیوە و پەرستوویانە ، لای ڕۆمانی‌یەکان بەخواوەندە ((دایانا )) ناوبراوەو لای بابلی‌یەکان بەناوی ((سین)) و لای یۆنانی یەکان بە ((ئەرتمیس)) و لای فیرعەونی‌یەکانیش بە ((خنصو )) ناوبراوە

مانگ لە ئەستێرە ناسی‌دا بەرپرسە لە ((هەست و ئەستەکان ،شاعیری ،دڵگیری ،ڕۆمانسی‌یەت ، هەستیاری ، سەرنج ڕاکێشان ، توانای گوێڕایەڵی ،تێگەیشتن ، هێمنی ،بیرکردنەوەی زۆر ،نهێنی پارێزی ، بێتوانایی لە جێبەجێ کردندا ، خەڵەتاندن ، چروکی ، سپڵەیی ، ڕاڕایی ، گومان ، تەمبەڵی ، خۆویستی ، سڵەمینەوەی لە ڕادەبەدەر، ترسنۆکی ، ڕەشبینی ، میزاجی ، هێزی یادەوەری ،

زانست خوازی ، ماڵداری ، وابەستەیی بە خێزانەوە بەتایبەتی دایك، هاوسۆزی لەگەڵ کەسانی تردا ، ئارەزووی هونەری ، فراوانی و قوڵی ئەندێشە ، تەرکیز کردن)).

ئەگەر سەرنج بدەین کاتی پڕ ((بدر)) بوونی مانگ هەڵکشان لەسەر ڕووی ئۆقیانووس و گۆماوەکان هەڵدەستێ و دیاردەی لە دایك بوون لە نێوان مرۆڤ و گیانەوەراندا بەڕێژەیەکی بەرچاوو دیار زیاد دەکات ، هەر لەم ماوەیەدا هەست دەکەین وزەیەکی زۆرمان هەیە بۆ جوڵە و هاتوچۆو چالاکی و بزووتن، بۆیە هاتووچۆی ڕێگاو بان و بازاڕو شوێنەگشتییەکان چڕ و ئاڵۆزیو هەڵچوونێکی بەسەردا دێت.

هەروەها مانگ کاردەکاتە سەر چەندین بواری جیاجیای ژیانی ڕۆژانەمان وەك : هەست و سۆز و باری دەروونی و ڕەفتار ، خەوو بە ئاگایی ، خوێن بەربوون لە کاتی نەشتەرگەری و برینداریدا ، چەندین تاوانی جۆراو جۆر ،بێنوێژی ئافرەتان و ڕێژەی لە دایك بوون و ڕەگەزی کۆرپەلە...

*نەشتەرگەرێکی فلۆریدایی دەڵێت:- لە ئەنجامی ئەو ئەزموون و توێژینەوانەی کارم تێداکردووە گەیشتوومەتە ئەو ئاکامەی کە کاتێك مانگ پڕ ((بدر)) ئەبێ ئەو نەخۆشەی نەشتەرگەری بۆ دەکرێت زیاتر لەوانیدی تووشی خوێن بەربوون دەبێت.

*(ئیدسۆن ئەندروس) لە ڕاپۆرتێکدا لە بارەی هەزار نەخۆشەوە کە لەسەر مێزی نەشتەرگەری یان دوای تەواو بوون خوێنیان بەر بووە دەڵێت: لە ٨٢٪ ی هەموو خوێن بەربوونەکان لە نێوان چارەکی یەکەمو چوارەمی مانگدا روویان داوە ، لە هەمووشی زیاتر کاتێك کە مانگ تەواو پڕ بووە ، دکتۆر ئەندروس ڕاپۆرتەکەی بەم سەرنجە کۆتایی پێ دێنێت و دەڵێت ئەم زانیاریانە ئەوندە ڕاستو بێ چەندو

چوونن به لامەوە دەترسم ببم بە دکتۆرێکی جادوگەرو هەر لە شەوانی تاریکدا نەشتەرگەری بکەم و شەوانی مانگە شەو بۆ غەرامیات بەجێ بهێڵم

*لێپرسراوانی (F.B.I)ی ئەمریکی بڵاویان کردۆتەوە لەکاتێکدا مانگ پڕ دەبێت ((ئاگر کەوتنەوە ، گیرفان بڕین ، موخالەفاتی شۆفێری ، تاوان و شێتی ، ناکۆکی نێوان ژن و مێرد و تەڵاق ، دڵ ڕەقی ، مەیلی یاسا شکاندن، حەزی سێکسی بەشێوەیەکی بەرچاو ڕوو لەزیاد بوون دەکات.

*لێکۆڵەوەری ئەمریکی (لیۆنارد رافیتز) لە زانکۆی (دیوك) لە لێکۆڵینەوەیەکیدا دەڵێت:- ((بەڵگەی لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەردەخەن کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان ڕەفتاری مرۆڤــ و مانگ دا هەیە ))، ناوبراو لە میانەی ماوەیەکی دیاری کراودا بەپێوانی ئەو بارگە کارەباییانەی لەشی مرۆڤ دەری دەکات بەشێوەیەکی بەردەوام، بینی ئەو بارگانە بەپێی قۆناغەکانی پڕی و کوڕی مانگ دەگۆڕێن ، کاتێك مانگ پڕ دەبێ لەش زۆرترین بارگە دەردەکات هەروەها لەشی کەسە نەخۆشە عەقڵی و دەروونی یەکان زیاتر لە خەڵکانی تر ئەم بارگانە دەردەکەن.

*شەوانی مانگە شەو بە شێوەیەکی سەیر کار لە هەندێ کەس دەکات ، وشەی (لوناسی) کە مانای شێتی دەدات (لونا) واتە مانگ ئەمەش پەیوەندی نێوان مانگ و شێتی نیشان دەدات ، ئەم کاریگەرییەی مانگ ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوەندە جێگەی باوەڕ بووە خراوەتە یاساوە ، دوو سەد ساڵ لەمەو بەر لە ئینگلتەرا جیاوازی دەکرا لە نێوان وشەی (insane) کە مانای شێت دەدات لە گەڵ وشەی (Lunatic) کە بە مانای ئەو کەسانەی جاری وایە بە هۆی مانگەوە تێك دەچن ، ئەگەر ئەم کۆمەڵەیەی دووەم لە کاتی پڕی مانگدا تاوانیان بکردایە دادگا سزایەکی کەمتری دەدان

چاودێرانی شێت خانەکان جاران لە مانگی پڕدەترسان و نەیان دەهێشت فەرمانبەرەکان لەو شەوانەدا بە ناو شێتخانەکەدا بگەڕێن ، هەروەها لە سەدەی

مەژدەهەمدا شەوی پێش مانگی پڕی تەواو لە نەخۆشەکانیان دەدا وەك هێمن کردنەوەیەك بۆ شەوی دواتر

*پزیشکی دەروونی (ئارنۆلد لایبر) پێیوایە کە کاریگەری مانگ لەبواری موگناتیسی زەوی دا دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە ڕەفتاری مرۆڤ داو ئەڵێ:- ((مانگ کاریگەری تەنها لەسەر هەست و سۆز و ڕەفتار و هەڵس و کەوتی مرۆڤ نییە بەڵکو کاریگەری لەسەر هەموو ئەو کردارە کیمیاییانەی ناو زیندەخانەکانیش هەیە، ئەمە سەرەرای کاریگەری لەسەر پیتاندنی هێلکەی ئافرەت لە ڕەحم دا )).

*پزیشکی دەروونی (مارك شۆپ) ی فەرەنسی وا دەبینێت کە نەخۆشە دەروونیەکان لە مانگە شەوەکاندا هەستیار تر دەبن ، هەروەها ئەو نەخۆشانەی کە شەقیقەیان هەیە بەڕێژەی ٢٠٪ئازاریان زیاد دەکات لەحاڵەتی ئاسایی خۆی.

*لە دۆزینەوەکانی زانایاندا هاتووە تیشکەکانی مانگ کاردەکەنە سەر ئەنزیمی میلاتۆنین ((ئەنزیمی خەوهاتن)) و دەبنە هۆی زۆ رسستی دەردانی ئەم ئەنزیمەو ئەمەش دەبێتە هۆی هەست کردن بە چوست و چالاك بوونی لەش و خەو لێ نەکەوتن.

*مانگ پەیوەندی‌یەکی ئەوەندە نزیکی بە منداڵبوونەوە هەیە لە هەندێ شوێن بە (مامانی مەزن) ناوی دەبەن

*دکتۆر (هانس گۆتمان) پسپۆڕی نەخۆشیەکانی ژنان و منداڵ بوون دەڵێت:- ((من (١٠٤٠٠) ژنم خستە ژێر تاقیکردنەوەوە بۆماوەی سێ ساڵی بەردەوام لە (٣٦) خولی مانگانەدا ، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی ژمارەی ئەو ژنانەی لە ڕۆژانی پڕی مانگ داهوزر ئەشۆن زیاترە لە دوو ئەوەندەی ئەو ژنانەی کە لە ڕۆژانی کوڕی مانگ دا هوزر دەشۆن، هەروەها دەڵێت ئەو ژنانە ڕێك چواردە ڕۆژ دوای پڕ بوونی مانگ سکیان پڕ ئەبێت ))

*له نێو ئەو لێکۆڵینەوانەی لەبارەی کاریگەریەکانی مانگەوە لەسەر زیندەوەرانی سروشت کراون ، لێکۆڵینەوەکەی د.(فرانك براون) مامۆستای بایۆلۆجی له زانکۆی ((نۆرث و یسترن)) ی ئەمریکی لەگەڵ تیمێک ی ل ێکۆڵەرەوەدا کە لەماوەی (٢٥) بیست و پێنج ساڵی ڕەبەق دا ئەنجامی داوە و بە (کاژێری بایۆلۆجی)) ناسراوە شوێنێکی تایبەتی هەیە، ئەم دکتۆرە گەیشتە تیۆرێك کە جێگەی سەرسوڕمانی نێوەندە زانستی‌یەکان بوو (براون) تەنها لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی پەتاتە نۆ ساڵی ڕەبەقی خایاندوە ، ئەو پێی وایە ڕیشاڵەکانی ڕەگی پەتاتە دەزانن ئاخۆ مانگ لە ئاسۆیە یان شاقوڵی‌یە یان خەریکە ئاوا دەبێت ، براون دەڵێت گۆڕانی لەم بابەتە لە ڕادەی میتابۆلیزم دا لە گەڵ کاتی ڕۆژی مانگی‌دا دەتوانرێت بەوە لێك بدرێتەوە کە هەموو شتێك وەڵامی هەڵگۆڕو داگۆڕێکی هاوبەش دەداتەوە کە بە پێی پیریۆدی مانگە

ئەمیش چەند نمونەیەکی کورتە لە لێکۆڵینەوەکانی:-

- ئەو مشکانەی کە لە ناو شتێکی یان شوێنێکی تاریك دا ماوەیەکی زۆر دەژین لەو کاتەدا چالاکتر دەبن کە مانگ پڕدەبێت هەر چەندەتیشکی مانگیش بەریان ناکەوێت٠
- باوەڕ وابوو کە لە کاتی هەڵکشانی ئاودا گوێچکە ماسی دەکرێتەوە بۆ ئەوەی خۆراك بخوات و لە کاتی داکشاندا دادەخرێ ،(د.براون)بە تاقی کردنەوە سەلماندی کە ئەم دیاردەیە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە قۆناغەکانی پڕی و کوڕی مانگەوە هەیە نەك دیاردەی هەڵکشان و داکشان٠
- ڕوەکی سێوە کێویلە ((Fiddler crabs))کە تامێکی ترشی هەیە،ڕەنگەکەی بە پێی قۆناغەکانی مانگ دەگۆڕێ٠

*چاکترین نمونەی هەستیاری بەرامبەر مانگ لە لای ئەو زیندەوەرانە دەست دەکەوێت کە لەدەریادا دەژین ، چونکە لە دەریادا تێپەڕینی مانگ تەکانی گەورە لە ئاوەکەدا دروست دەکات

*دەریاچەی (ڤیکتۆریا) بەسەر هێڵی کەمەرەییدا درێژ بوەتەوە کەچی جۆرێکی سەرکەوتوو مێشی میوەی تێدایە بە ناوی (پۆڤیللا ئادۆستا) ئەم مێشانە تەنیا لەکاتی پڕی مانگدا دێنە دەرەوە

*کرمی (ئیونیسی ڤیریدیسە) کە جۆرێکی پانی توکنی کرمی زەوی‌یە لە تشرینی دوەمی هەموو ساڵێکدا لە شەبەقی ئەو ڕۆژەدا کە مانگ دەگاتە دوا چارەکی بەشی پاشەوەیان بەرلادەکەن‌و دەریاکانی دەورو بەری (ساموا) و (ڤیجی) بە هێلکە سور دەکەن‌و خەڵکی ئەو ناوچەیەش لەم کاتەدا بە سواری بەلەمی درێژەوە کۆدەبنەوەو ئاهەنگی (سەرهەڵدانی مەزن) دەگێڕن‌و شایی بۆ بەرەکەتی ئەو سەرهەڵدانە دەکەن

* لە فیلمی سینەمایی (گورگە پیاو))دا قەرەجەکە بە ((لۆنجانی ))دەڵێ:- ((تەنانەت ئەو کەسەی دڵێکی پاك و بێگەردیشی هەبێ‌و شەو نوێژیش بکات ئەگۆڕێ‌و ئەبێ بەگورگ لەو کاتەدا کە گوڵە زەردەی بەهار دەکرێتەوە و مانگ پڕو درەخشان ئەبێت[٢] ..

[٢] لەو کاتەدا خۆر لە بورجی ((١-کاور))دا دەبێت‌و مانگیش لە بورجەکانی ((٦-فەریك،٧-تەرازوو،٨-دووپشك))دا دەبێت بەڵام ئەو کاتەی کە دەکەوینە بارێکی شەڕانگێزی زیاترەوە مانگ لە بورجی (٨-دووپشك)دا دەبێت،((١-کاور)و((٨-دووپشك))هەردووکیان هەسارەیان((مەریخ))ەو((٨-دووپشك)) هەسارەی ((پلۆتۆ))شی هەیە((مەریخ))هەسارەی سوور نیشانەی خوێن و شەڕولەکۆندا خواوەندی شەڕ بووە (پلۆتۆ))ش هەسارەی ڕووخان و کاولکردنە لە ڕێگەی هێزەوە.

کاتێ مانگ لە بورجێك دا پڕ ئەبێ ئەوا زۆر لە خەڵکی ((ئەوانەی ئەو بورجە ئەگونجێ لە گەڵیاندا کە مانگ تیایدا پڕە[٤] ))هەست دەکەن سیفاتی ئەو بورجەیان هەڵگرتووە ،بەڵام ئەوانەی ئەو بورجە لە گەڵیاندا ناگونجێ هەست بە سەپاندنی سیفەتەکانی ئەو بورجە دەکەن ئیتر یا ئەوەتە خۆیان بە دەستەوە ئەدەن و ئەو سیفەتانە قبوڵ دەکەن و لاسایی کەسایەتی یەکی نەگونجاو لەگەڵ خۆیاندا دەکەنەوەو ئەمەش گیروگرفتی بەدواوەیە،یان ئەوەتە بە ئیرادەوە بەرەنگاری ئەو کاریگەری‌یانە دەبنەوەو ڕەتی دەکەنەوە ،ئەمەش دەکەوێتە سەر ئیرادەی کەسەکان.

تێبینی کراوە کاتێك مانگ لە بورجێك دا پڕ ئەبێ بورجە هاوڕەگەزەکانی زیاتر ئەو سیفەتانەی ئەو بورجە وەردەگرن و لەگەڵیشیاندا ئەگونجێ و بەکارێکی ((ایجابی))ش دادەنرێ،واتە کاتێ مانگ لە بورجێکی هەوایی دا پڕ دەبێت ئەوا ئەو کەسانەی هەمان بورج و دوو بورجە هەوایی‌یەکەی تر ئەو سیفەتانە بەباشی وەردەگرن و قبوڵی دەکەن.

ئەو کاتەی مانگ لە بورجەکەماندا یان طالعەکەماندایە بە ماوەیەکی چاك دەژمێردرێ و دەتوانین هەنگاو بنەین بەرەو قۆناغێکی تازەو سەرکەوتن بە دەست بێنین،هەروەها دەکرێ جارێکی تر هەوڵ بۆ ئەو کارە بدەینەوە کە پێشتر تیایدا سەرکەوتوو نەبووین

کاتێ مانگ لە بورجی تەنیشت بورجەکەتەوە بێت بە تایبەتی بورجی پێش بورجەکەت ئەوا ماوەیەکی خراپت بۆ دروست دەکات و بە ( خولی هاتنە خوارەوە )

---

[٤] ئەو بورجانەی لەگەڵ یەکتردا دەگونجێن بەپلەی یەك بریتین لە:-ئاگری و ئاگری،خۆڵی و خۆڵی،هەوایی و هەوایی،ئاوی و ئاوی بەپلەی دوو بریتین لە:-ئاگری و هەوایی،خۆڵی و ئاوی واتە بە گشتی بورجە گونجاوەکان بریتین لە:-نێرونێر ،مێ‌ومێ.

ناو دەبڕێ و وا چاکە لەم ماوەیەدا بارودۆخەکە وەك خۆی ڕاگریت و بڕیار لە سەر هیچ جۆرە گۆڕانکاری یەکی تازە نەدەیت و ئارام بگریت تا مانگ دەگاتە بورجی پاشتر،بەڵام ئەگەر مانگ لە بورجی پاش بورجەکەت بوو ئەوا ڕەنگە دیاری‌یەك یان بڕێك پارەت بە دەست بگات.

هەروەها ئەو کاتەی مانگ لە نێوان دوو بورج دا ئەبێ ماوەیەکی نائاسایی و خراپ پێك دێت و و وا چاکە هەنگاو نەنرێ بەرەو هیچ پرۆژەو چالاکی‌یەکی تازەو جێبەجێکردنی هیچ جۆرە شتێکی گرنگی پێدراو ،کە ئەم ماوەیەش زۆر کورتە و (٤-٨)کاژێر زیاتر ناخایەنێ،هەروەها ئەگەر مانگ لە بورجێك دابێ کە لەگەڵ بورجەکەی ئێمەدا نەگونجێ ئەوا هەست بە نائاسودەیی دەکەین لە هەندێ ڕووەوە بۆ ماوەیەکی کاتی و دیاریکراو تا لەو بورجە دەردەچێت

ئەستێرە ناسان پێیان وایە کە مانگ کاریگەری‌یەکی گەورەی هەیە لەسەر نەخشەی گەردوونی کەسایەتی یەکان لە کاتی لە دایك بووندا ،لێرەدا پرسیارێك خۆی دەردەخات ،ئایا کاریگەری‌یەکانی مانگ و خۆر کامیان لەوی دی یان زیاترە؟...ئەوەی گومان هەڵناگرێو ئاشکرایە کە وەڵامی زۆربەی یان سەرجەمی ئەستێرەناسان ئەوەیە کاریگەری خۆر زۆر زیاترە لە هی مانگ، بەڵام من پێم وایە لە ڕووی ئەستێرەناسی‌یەوە وەڵامەکە بە پێچەوانەوەیە،چونکە هەرچەندە تیشك و وزەی خۆر یەکێکە لە سەرچاوە هەرە سەرەکی‌یەکانی ژیانی زیندەوەرانی سەرگۆی زەوی و بە بێبوونی ئەو سەرچاوەیە بوونی زیندەوەریش مەحاڵەو نابێ،بەڵام ئەم کاریگەری یانەی خۆر سەرجەمیان ناچنە بواری ئەستێرە ناسی‌یەوە و ئەو کاریگەری‌یانەی مانگ هەیەتی وەك کاریگەری بۆ سەر هەست و سۆزو باری دەروونی و ڕەفتارو جوڵەو بزوتن و ....هتدزیاتر دەچنە بواری ئەستێرە ناسی‌یەوەو ئەستێرە ناسانیش مەبەستیانە ،ئەویش بەهۆی نزیکی و هێزی کێش کردن و جۆری تیشكو شەپۆلە کارۆموگناتیسی‌یەکانی مانگەوەیە کە

تایبەتمەندی خۆیان هەیە ،هەروەها ئەگەر تێبینی ئەو پێشبینییانە بکەین کەلە سەر مانگ و خۆر دانراون لە بورجەکاندا یان سەرنج لەوە بدەین کە مانگ کار لە ڕەگەزی کۆرپەلەی دروست بووش دەکات لەکاتی گەیشتنی تۆوی پیاو بە هێلکەی ئافرەت لە ڕەحم دا،واتەمانگ دەستی گرتووە بەسەر تۆو((سپێرم))یش داو بە کاریگەری ئەو کۆرپەلەی نێر یان مێ دەخولقێ.

هەروەها پێویستە ئەوەش بوترێ کە مانگیش کاریگەری یەکەی لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر کەم و زیادێکی بەسەردا دێت کەلە دواتردا بەچەند خاڵێك باسی لێوە دەکەین لەبەر ئەم هۆیانەش وا پێویستە بۆ پێشبینی و دۆزینەوەی بورجەکان و کاریگەری یەکان بە پلەی یەك سەرنج بدرێ لە مانگ و بزانرێ کاریگەری یەکەی بە چ ئەندازەیەکە و دواتریش سەرنجی خۆرو هەسارەکانی تری کۆمەڵەی خۆر لە بورجەکان دا.

# شـــــــــوێنەکانی مـــــانگ

مانگ لەماوەی سوڕێکی بەبازنەی خەیاڵی (زودیاك ) واتە دوانزە بورجەکە دا دەچێتە (٢٨) بیست و هەشت شوێنی بەرچاوو دیارەوە کەپێ یان دەوترێ شوێنە کانی مانگ (( منازل القمر )) هەریەکە لەم شوێنانەش بە ناوی ئەستێرەیەك یان چەند لە ستێرەیەکەوە ناونراون

ئەم شوێنانە هیچ پەیوەندییەکی ڕاستە وخۆیان بە مانگە کۆچی یەکان یان پڕی‌و کوڕی مانگەوە نیيە ، واتەهەموو (پانزەی) یان ( یەکی ) مانگی کۆچی یەك مانگ لەهەمان شوێندانی یە ، بەڵکو هەر شوێنێك یان دوان و سیان بەنەگۆڕی لە بورجێك داجێگیرن ، ئیتر هەر کاتێ مانگ ئەچێتە بورجێکەوە ئەوا ئەچێتە ئە و شوێنانەوە کە لەو بورجەدان

نموونە : کاتێ مانگ لەسەرەتای بورجی (( ١ –کاوڕ )) دابێ ئەوا لە (( شرطين )) یش دا دەبێ ، پاشان هەردوابەدوای ئەو لە هەمان بور ج دا دەچێتە ((بطين))ەوە ، لەسەرەتای بورجی ((٢–گا))داله ((ثريا)) و لە کۆتایی هەمان بور ج دا لە((دبران )) دا یە هتد ، بەپێی ئەم خشتەیە :.

| ژ | شوێنەکانی مانگ | پیتەکان | شوێنیان لە بورجەکاندا |
|---|---|---|---|
| ١– | شرطين | ا | ١–کاوڕ |
| ٢– | بطين | ب | ١–کاوڕ |
| ٣– | ثريا(پەروین) | ج | ٢–گا |
| ٤– | دبران | د | ٢–گا |
| ٥– | هقعة | ه | ٣–دوانە |
| ٦– | هنعة | و | ٣–دوانە |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧- | ذراع | ز | ٣-دوانه |
| ٨- | نثرة | ح | ٤-قرژاڵ |
| ٩- | طرفة | ط | ٤-قرژاڵ |
| ١٠- | جبهة | ی | ٥-شێر |
| ١١- | زبرة | ك | ٥-شێر |
| ١٢- | صرفة | ل | ٥-شێر |
| ١٣- | سماك | م | ٦-فەریك |
| ١٤- | عواء | ن | ٦-فەریك |
| ١٥- | غفر | س | ٧-تەرازوو |
| ١٦- | زبانا | ع | ٧-تەرازوو |
| ١٧- | اكليل | ف | ٨-دووپشك |
| ١٨- | قلب العقرب | ص | ٨-دووپشك |
| ١٩- | شولة | ق | ٨-دووپشك |
| ٢٠- | نعائم | ر | ٩-كەوان |
| ٢١- | بلدة | ش | ٩-كەوان |
| ٢٢- | ذابح((چل چرا)) | ت | ١٠-گیسك |
| ٢٣- | بلع | ث | ١١-سەتڵ |
| ٢٤- | سعود | خ | ١١-سەتڵ |
| ٢٥- | اخبية | ذ | ١١-سەتڵ |
| ٢٦- | مقدم | ض | ١٢-نەهەنگ |
| ٢٧- | مؤخر | ظ | ١٢-نەهەنگ |
| ٢٨- | رشا | غ | ١٢-نەهەنگ |




هەوڵدرا ناوی کوردی شوێنەکانی مانگ بەتەنیشت ناوە عەرەبییەکانەوە بنوسرێ بەڵام لەناوی تەنها دوان زیاتر بەدەستەوە نەهات ، ئەودووانەش رەنگە بە هۆی ناسراویانەوە لەمەترسی لەناوچوون بە دوور بوبن ، چونکە لەکاتی لەدایك بوونی پێغمبەردا محەمەد( د.خ) ، خۆر لە(پەروین ، کۆ ) دا بووە ، هەروەها لەکاتی لەدایك بوونی حەزرەتی مەسیح دا(د.خ ) ، خۆر لە ( چلچرا ) دابووە ، یان ڕەنگە هۆکاری تریش هەبێ کە ئەم دوو کۆمەڵە ئەستێرەیە هێندە ناسراوبن لەوانە جوانی بریسکەو بریق و باقی ئەستێرەکانیان سەرنجی زۆر کەس رادەکێشن .

# جووت بوون له گه‌ڵ مانگ

چه‌ند ساڵێکی زۆر به‌ر له‌ ئیستا پزیشکێکی به‌ریتانی که‌ ماوه‌یه‌کی زۆر له‌ بانه‌کانی تبت و هندستان و پیرۆ ژیا بوو ویستی نه‌ریتێکی کۆن زیندوو بکاته‌وه‌ ئه‌ویش جووت بوون له‌ گه‌ڵ مانگ ((التزوج من القمر)) بوو ، ئه‌م پزیشکه‌ هه‌ستا به‌ کۆکردنه‌وه‌ی چه‌ند کیژۆڵه‌یه‌کی جوان که‌ له‌ ئێواره‌و ڕۆژئاوابوونه‌وه‌ جل و به‌رگیان داده‌ناو به‌ڕووتی له‌به‌ر تیشکی مانگ و ئه‌ستێره‌کان ده‌نووستن تا به‌یانی و خۆرهه‌ڵات به‌ نیازی ئه‌وه‌ی سکیان پڕبێ به‌ هۆی تیشك و شه‌پۆلی گه‌ردوونی‌یه‌وه‌ ، شایانی باسه‌ خودی پزیشکه‌که‌ش که‌ ته‌مه‌نی شه‌ست ساڵ بووه‌ به‌شداریانی کردوه‌و به‌ دووری نه‌زانیوه‌ موعجیزه‌یه‌ك رووبدات هه‌رچه‌نده‌ توانای دووگیان بوونی نه‌مابوو ، سه‌یر له‌وه‌دایه‌ له‌ کوتو پڕێکدا یه‌کێك له‌ کیژۆڵه‌کان نیشانه‌کانی دوو گیانی لێوه‌ ده‌رکه‌وت ، پاشان چه‌ند پزیشکێکی پسپۆڕ داوه‌ت کران به‌ مه‌به‌ستی پشکنین و چاودێری ، یه‌که‌م شتێ که‌ سه‌لماندیان کچێنی کیژۆڵه‌که‌ بوو، ئه‌وه‌ی مایه‌ی سه‌رسوڕمانی پزیشکه‌کان بوو گه‌شه‌ی کۆرپه‌له‌که‌ بوو که‌ به‌ خێراییه‌کی ناسروشتی گه‌شه‌ی ده‌کرد ، به‌ جۆرێك له‌ دوای سێ مانگ کۆرپه‌له‌که‌ هێنده‌ی قه‌باره‌ی منداڵێکی نۆمانگ ده‌بوو !....

پاشان منداڵێکی مردوو له‌ دایك بوو ، که‌سه‌ری گه‌وره‌و په‌ل کورت بوو هه‌رچاوێکی له‌ ڕه‌نگێك بوو، به‌ڵام له‌ هه‌مان ڕۆژی له‌دایك بوونی کۆرپه‌له‌که‌ پزیشکه‌که‌ش مردوو کۆمه‌ڵه‌که‌یان هه‌ڵوه‌شایه‌وه‌ به‌م جۆره‌ش هیچ هیوایه‌ك نه‌ما بۆ له‌ دایك بوونی منداڵێکی گه‌ردونی یان مانگی تر .

# هــــــۆی کاریگەری یەکانی مانگ

سەرجەم کاریگەری‌یەکانی مانگ دەکەوێتە سەردوو هۆکاری سەرە کی

١ هێزی کێشکردن ئاشکرایە تا دووری نیوان دووتەن کەمتربێت و بارستایەکەیان گەورەتربێ هێزی کێشکردنی نێوانیان زیاتر دەبێت هەرچەندە بارستایی مانگ بچوکە لەچاو تەنەکانی تری ئاسماندا ، بەلاّم بەهۆی نزیکی‌یەکەی لەزەوی یەوە کاریگەری‌یەکی گەورەی هێزی کێشکردنی هەیە بۆسەرزەوی ، ئەوەتا جگە لەهەڵکشان و داکشانی ئاوی دەریاو ئۆقیانووسەکان وشکانیش خۆی لەبەر هێزی کێشکردنی مانگ دا ڕاناگرێ لەکاتی پڕبوونی مانگ دا بەهۆی زیاتر نزیك کەوتنەوەی مانگەوە لەزەوی لەو جێگایەی مانگ شاقوڵی دەبێت (( ٣٦ )) سم ڕووی زەوی هەڵدەئاوسێت .



٢.تیشك و شەپۆلە كارۆ موگناتیسی یەكانی مانگ :.تیشكی زیوین وشە پۆلە كارۆ موگناتیسی یەكانی مانگ هۆكارێكی تری كاریگەری یەكانێتی ،
ئەمیش بەهەمان شێوە تا مانگ پڕتربێ و نزیكتربێ لەزەوی‌یەوە كاریگەری زیاتر دەبێ بۆسەر زیندەوەرانی سەر زەوی

وا دیارە مانگ بە زۆر شێوە كار لە مرۆڤ دەكات ، كاریگەری مانگ كاریگەری‌یەكی ڕاستەوخۆیە كە ڕاستەوخۆ كار لە مرۆڤ و زیندەوەران دەكات بە هۆی هێزی كێش كردن و تیشك و شەپۆلە كارۆموگناتیسییەكانەوە یان كاریگەریەكی ناڕاستەوخۆیە لە ڕێگەی كاریگەری بۆ سەر هێزی موگناتیسی زەوی و هێزی موگناتیسی زەویش كار لە سەرجەم زیندەوەران دەكات

# مانگ وڕەگەزی کۆرپە لە

ئایا ئەزانی بۆچی یان هۆی چی‌یە نێرینە یامێنیەیت !؟...

بــەڵێ مــانگ بەرپرســە لــە ڕەگــەزەکان و بــەهۆی مانگــەوە ئــەو ڕەگــەزەمان پێبەخشراوە ئیتر ئەگەر نێر بین یامێ،ئەم کاریگەری و بەرپرسیارێتی‌یەی مانگ هەر تەنها بەسەرسەری مرۆڤەوە خول ناخوات بەڵکو لەسەر ئاژەڵیش چەندین جار تاقیکراوەتەوە و ڕەنگە بۆ سەرجەم شیردەرەکان و زیندەوەری تریش بشێ.

((ئەبومەعشەری فەلەکی))بەڕێگایەکی سەیرو دوور لە زانستی ویستوویەتی بزانێ کۆرپەلەی سکی دایك کوڕە یان کچ،ئەویش ئەم ڕێگایەی خوارەوەیە:-

حیسابی ئەبجەدی ناوی سك پڕو دایکی+ناوی ئەو ڕۆژە کە سك پڕ پرسیاری تێدا دەکات لە بارەی کچ یا کوڕەوە ،پاشان ((٤ ، ٤))چوار چوار لێ‌ی کەم دەکرێتەوە تا ژمارەیەکی کەمتر لە پێنج ئەمێنێتەوە ،ئەگەر یەکی مایەوە ئەوا کوڕی ئەبێ،ئەگەر دووی مایەوە ئەوا کچی ئەبێ،ئەگەر سێ‌ی مایەوە ئەوا منالی نابێ یا ئەمرێ ،ئەگەر چواری مایەوە ئەوا دووانەی ئەبێ.

بەلاّم ئێستا زانستی ئەستێرە ناسی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ئەم تەلیسمەی شکاندووە و پەردەی لەسەر ڕووی گەشی هەڵماڵیوە.

ئەگەر مانگ لە ساتەوەختی کرداری پیتاندن و دروستبوونی زایگۆت لە نێوان نێرو مێ‌دا لە بورجێکی نێرینەدا بوو ئەوا لە دایك بووەکە نێرینە ((کوڕ))دەبێت،بەلاّم

ئەگەر مانگ لەو ساتەوەختەدا لە بورجێکی مێینەدا بوو ئەوا لەدایك بووەکە مێینە((کچ))دەبێت[٥]

ئیستا لێکۆڵینەوە لە بارەی تۆو کردنی دەست کردەوە دەریخستوە کە تێپەڕاندنی تەزویەکی کارەبایی لاواز بە ناو تۆودا دەبێتە هۆی جیابونەوەی تۆوی نێرینە (X.Y) لە تۆوی مێنە (X.X) ، دەزانین مانگ گۆڕانی ڕێكو پێك لە کایەی موگناتیسی زەویدا دروست دەکاتو ژیانیش هەستیارە بەرامبەر بەم گۆڕانە شتێکی سادەو لۆژیکی‌یە لەم پێودانگوە وای دابنەین شتێکی لەو بابەتە لە ناو لەشی گیانەوەری زیندوشدا روو دەدات ، کاریگەری کایەی دەوروبەر لەسەر تۆو زیاترە چونکە لە زۆربەی شیردەرەکاندا تۆو لە دەرەوەی لەشدا دروست دەکرێو کۆ دەکرێتەوە ، دۆزینەوەکەی (جۆناس ) دووشتی گرنگمان پێ دەڵێت یەکێکیان ئەوەیە لە ژێر کاریگەری ڕیتمێکی ڕێكوپێکی (٥٤,٦٤) کاژێریدایە دووەمیش ئەوەیە ئەم ڕیتمە هەروەك ئەوەی ئەستڕۆلۆجی کلاسیکی‌یە ئەم مەسەلەیەش زۆر گرنگە بۆ ئەستێرەناسی نوێ.

پێویستە بزانین کە بورجە نێرینەکان بورجە تاکەکانن ((١-کاور،٣-دووانە،٥-شێر،٧-تەرازوو،٩-کەوان،١١-سەتڵ))بورجە مێینەکانیش بورجە جووتەکانن((٢-گا،٤-قرژاڵ،٦-فەریك،٨-دووپشك،١٠-گیسك،١٢-نەهەنگ))لەبەر ئەوەی بۆ ئەم مەبەستە پێویستمان بە زانینی جوڵەو شوێنەکانی مانگ((هەیڤ))ە زۆر گەڕام بە دوای سەرچاوەیەك دا بەڵام جگە لە سەرچاوەیەکی

---

[٥] پزیشکی ئەمریکی ((یوجین جۆناس))لە ئەزمونێکی بێ‌هاوتادا تا ساڵی ((١٩٩٥.ز))ئەنجامی دا،ڕێژەی سەرکەوتنی بە((٩٥٪))خەملاند سەرەڕای ئەمە بۆ خۆم چەندین حاڵەتم لەسەر مرۆڤ و هەندێ ئاژەڵ تاقی‌کردوەتەوە بەیارمەتی هەندێ هاورێ و دۆست کە جێگای ڕێزن لام .

هۆی کە ناتوانرێ متمانەی لە سەر بکرێ هیچی ترم وە دەست نەهات کە ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:-

(ژمــارەی ڕۆژی مــانگی کۆچــی×٢) + ٥ =ئــەنجام دەکاتەیــەکێ لــەم ژمارانــەی خوارەوە:-

| | | |
|---|---|---|
| ٥ ← ١٠ | ١٠ ← ١٥ | ١٥ ← ٢٠ |
| ئەو بورجەی خۆری تێدایە | بورجی پاش ئەو | بورجی پاشتر |
| ٢٠ ← ٢٥ | ٢٥ ← ٣٠ | ٣٠ ← ٣٥ |
| بورجی پاشتر | بورجی پاشتر | بورجی پاشتر |
| ٣٥ ← ٤٠ | ٤٠ ← ٤٥ | ٤٥ ← ٥٠ |
| بورجی پاشتر | بورجی پاشتر | بورجی پاشتر |
| ٥٠ ← ٥٥ | ٥٥ ← ٦٠ | ٦٠ ← ٦٥ |
| بورجی پاشتر | بورجی پاشتر | بورجی پێش شوێنی خۆر |

بــۆ نمونـــە/کـــازێر نـــۆی شـــەوی (١١-١٢ /١/ ٢٠٠٣.ز)کـــە ڕێکـــەوتی سەرەتای(٠٩/١١-ذوالقعدة / ١٤٢٣. کۆچی)دەکات، بەپێی یاساکە.

(٩× ٢) + ٥ =٢٣

لەو کاتەدا خۆر لە بورجی ((١٠-گیسک))دایەوبەم شێوەیەش مانگ لە بورجی ((١-کاوڕ))دایە بە پێی یاساکە:-

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥ ←١ | ١٠ ١٥ | ١٥ ←٢٠ | ٢٠ ٢٥ ← |
| گیسک | ١١-سەتڵ | ١٢-نەهەنگ | ١-کاوڕ |

بەلأم لە ڕاستیدا مانگ لە بورجی ((٢-گا))دایە بە کورتی دەتوانین گیروگرفتەکانی ئەم یاسایە لە چەند خالێك دا کۆبکەینەوە

١. ڕەچاو نەکردنی پلەی ئەو بورجەی کە خۆری تێدایە و تەنها بورجەکەی ڕەچاو کردووە و گوێی بەوە نەداوە ئاخۆ خۆر لە سەرەتا یان ناوەڕاست یان کۆتایی و پلە بە پلەی چ بورجێك دایە

٢. یاساکە بە هیچ جۆرێ باسی لەوە نەکردووە کە هەندێ مانگی کۆچی ((٣٠))ڕۆژەو هەندێکی تر ((٢٩))ڕۆژەو هەردووکیانی بەیەك چاو تەماشا کردوە و هیچ ڕێگایەکی گونجاویشی بۆ نەدۆزیوەتەوە

٣ یەکێ لە مەرجەکانی ئەم یاسایە ئەوەیە ئەبێ بزانین ئەو کاتەی بۆ شوێنی مانگ ((هەیڤ))دەگەڕێن چ ڕۆژێکی مانگی کۆچی یە کە ئەویش نەزانراوە،واتە لە نادیاردا بۆ نادیار دەگەڕێن

بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە ئەم یاسایە لە زۆر ڕووەوە کەم و کوڕی زۆرەو ناتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ

ئەگەر بمانەوێت بەسەر خاڵە لاوازەکانی یەکەم و دووەم دا زاڵ بین و بە شێوەیەکی وردتریش یاساکە داڕێژین دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە دایڕێژین :-

١. بۆ ئەو مانگە کۆچی‌یەی ((٢٩))ڕۆژ بێت بەم شێوەیە:-

لەبەر ئەوەی ٣٦٥,٢٤٢١٩٨÷٢٩=١٢,٥٩٤٥٥٨٥٥١٧کەواتە ژمارەی ڕۆژی مانگی کۆچی ×١٢,٥٩٤٥٥٨٥٥١٧=ژمارەی پلەکانی ئەولای شوێنی خۆر کە شوێنی مانگە لەو ساتەدا.

٢. بۆ ئەو مانگە کۆچی‌یەی ((٣٠))ڕۆژ بێت بەم شێوەیە:-

لە بەر ئەوەی ٣٦٥,٢٤٢١٩٨ ÷٣٠=١٢,١٧٤٧٣٩٩٣٣٣ کەواتە ژمارەی ڕۆژی مانگی کۆچی ×١٢,١٧٤٧٣٩٩٣٣٣ =ژمارەی پلەکانی ئەو لای شوێنی خۆر کە شوێنی مانگە لەو ساتەدا.

پاشان ژمارەی پلەکانی ئەو لای شوێنی خۆر +ژمارەی پلەو بورجی شوێنی خۆر - ژمارەی پلەو بورجی شوێنی مانگ.
شایەنی ووتنە کە ژمارەی پلەکانی شوێنی خۆریش زانراوە و بە هۆی ڕۆژمێری کوردی‌یەوە دەتوانین شوێن و جێگای خۆر لە بورجەکاندا دیاری بکەین چونکە ڕۆژمێری کوردی لە بنچینەدا لە سەر شوێنی خۆر دانراوە و ژمارەی ڕۆژو مانگی کوردی ژمارەی پلەو بورجی شوێنی خۆر دەنوێنێت،بۆ نمونە لە بەرواری((١١/٩ ڕێبەندان ))کوردی، دا خۆر لە ((٩))نۆ پلەی بورجی ((١١–سەتڵ))دایە.
پێویستە ئەوەش بزانین کە بورجەکانی ((مانگە کوردی‌یەکانی ))(١، ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ ، ٦ ))((٣١))سی‌ویەك و بورجەکانی ((مانگە کوردی‌یەکانی )) (٧ ، ٨ ، ٩ ، ١٠ ، ١١ ))((٣٠))سی پلە یان ڕۆژن بەڵام بورجی ((مانگی کوردی)) (١٢)سێ سوڕی یان ساڵی ئاسایی دوابەدوای یەك ((٢٩))پلەیە و ساڵی چوارەم و پڕ((٣٠))پلەیە بە پێی سوڕی خۆر بە بورجەکان و ڕۆژمێری کوردی ،بەڵام ئەمە بۆ سوڕی مانگ ((هەیڤ))ناگونجێ،چونکە هەرچەندە جیاوازی خێرایی هەیە لە سوڕی زەوی لە نێوان سەرەتای ساڵ بۆ ناوەڕاست و ناوەڕاست بۆ کۆتایی ساڵ دابە جۆرێ کە زەوی لە سەرەتای ساڵەوە بە (١٨٦)ڕۆژ دەگاتە ناوەڕاستی ساڵ و لە ناوەڕاستی ساڵیشەوە بە (١٧٩,٢٤٢١٩٨)ڕۆژ دەگاتە کۆتایی ساڵ بەڵام لە سوڕی مانگدا جیاوازی خێرایی‌یەکە زیاترەو مانگ ((هەیڤ)) لەسەرەتای مانگی کۆچی‌یەوە تا ناوەڕاستی مانگ بەنزیکەی (١٥,٣٥)ڕۆژ دەبڕێ و لە ناوەڕاستی مانگیشەوە بۆ کۆتایی مانگی کۆچی بە نزیکەی (١٤,١٨) ڕۆژ دەبڕێ، ئەمەش بە هۆی هێزی کیش کردنی خۆرەوەیە لەسەر مانگ و ئەوکاتەی مانگ لەسەرەتای مانگی کۆچی‌یەوە بەرەو ناوەڕاستی مانگ دەڕوات هێزی کیش کردنی خۆر پێچەوانەی ئاراستەی جوڵەکەیەتی بەڵام ئەو کاتەی مانگ (هەیڤ) لە ناوەڕاستی مانگی کۆچی‌یەوە بەرەو کۆتایی مانگ دەڕوات هێزی کێشکردنی خۆر ڕاستەوانەی

ئاراستەی جوڵەکەیەتی و وادەکات خێرای جوڵەی مانگ لەسەرتاوە بۆ ناوەڕاستی مانگی کۆچی، کەمتربێت لە خێراییەکەی لە ناوەڕاستەوە بۆ کۆتای مانگی کۆچی ، هەروەها لەبەر ئەوەی جیاوازی خێرایی مانگ زیاترە لە جیاوازی خێرایی زەوی کە ئێمە بەپێی ئەستێرەناسی بەجوڵەی خۆری دادەنێین، بۆیە پێویستە بۆ سوڕی مانگ لە بورجەکاندا جیاوازی پلەی بورجەکانی سەرەتا زیاتر بکەین لە پلەی بورجەکانی کۆتا بە جۆرێك لەگەڵ ناوەند و تێکڕای سوڕەکەدا بگونجێت ،پێویستە ئەوەش بزانین کە مانگ ((هەیڤ)) لە ماوەی مانگێکی کۆچی دا نزیکەی (١٣)سیانزە بورج دەبڕێ نەك (١٢) دوانزە چونکە لەماوەی سوڕێکی دا بەدەوری زەویدا زەویش بورجێك دەبڕێ کە ئێمە بەجوڵەی خۆری حساب دەکەین ، بۆیە لە ماوەی مانگێکی کۆچیدا سێ ئەگەرمان هەیە:

١- ئەگەر خۆر لە بورجێکی ((٣١)) ڕۆژی (پلەیی) دا بوو ئەوا مانگ لەماوەی مانگێکی کۆچیدا (٣٦٥/٢٤٢١٩٨)+(٣١)= (٣٩٦,٢٤٢١٩٨)پلە دەبڕێ و بەم شێوەیەش دابەشی دەکەین بەسەر بورجەکاندا ، سێ بورجی سەرەتای بڕینی مانگ هەریەکەیان بە (٣٢)پلە دادەنێین و هەریەکە لەسێ بورجی پاشتر بە (٣١)پلە دادەنێین چوار بورجی پاشتر بە (٣٠)پلە هەریەکەیان حیساب دەکەین و بورجی دوای ئەوانیش بە (٢٩,٢٤٢١٩٨)پلە دوو بورجی کۆتای بە (٢٩) دادەنێین دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە سەرسێ ئەگەرەکە بخەینە ڕوو.

| ژ | یەکەم /ئەگەر خۆر لە بورجێکی ((٣١))سی و یەك پلەی دابوو ٣٦٥. ٢٤٢ ١٩٨ ٣١+ ٢٩٦,٢٤٢١٩٨- | دووەم/ئەگەر خۆر لە بورجێکی ((٣٠))پلەیی دا بوو٣٦٥,٢٤٢١٩٨ ٣٩٥,٢٤٢١٩٨-٣٠+ | سێیەم/ئەگەر خۆر لە بورجێکی ٢٩,٢٤٢١٩٨پلەیی دا بوو٣٦٥,٢٤٢١٩٨+ -٢٩,٢٤٢١٩٨ ٣٩٤,٤٨٤٣٩٦ |
|---|---|---|---|
| ١ | ٣٢ | ٣٢ | ٣٢ |
| ٢ | ٣٢ | ٣٢ | ٣٢ |
| ٣ | ٣٢ | ٣٢ | ٣٢ |
| ٤ | ٣١ | ٣١ | ٣١ |
| ٥ | ٣١ | ٣١ | ٣١ |
| ٦ | ٣١ | ٣١ | ٣١ |
| ٧ | ٣٠ | ٣٠ | ٣٠ |
| ٨ | ٣٠ | ٣٠ | ٣٠ |
| ٩ | ٣٠ | ٣٠ | ٣٠ |
| ١٠ | ٣٠ | ٣٠ | ٢٩ |
| ١١ | ٢٩,٢٤٢١٩٨ | ٢٩ | ٢٩ |
| ١٢ | ٢٩ | ٢٩ | ٢٩ |
| ١٣ | ٢٩ | ٢٨,٢٤٢١٩٨ | ٢٨,٤٨٤٣٩٦ |
| | ٣٩٦,٢٤٢١٩٨ | ٣٩٥,٢٤٢١٩٨ | ٣٩٤,٤٨٤٣٩٦ |

ئەمەش نموونەیەکە لە دۆزینەوەی شوێنی مانگ بە پێی ئەو یاسایەی باسمان کرد:-

(۷/ ۱۰-شوال/١٤٢٣.کۆچی)-بەرامبەر(۱۱/۱۲/۲۰۰۲ .زایینی)-بەرامبەر (۲۰/۹-سەرماوەرز/۲۷۰۲.کوردی) ،ئەگەر مانگی کۆچی شەوال ((۳۰))ڕۆژ بێت ژمارەی ڕۆژی مانگی کۆچی ×١٢,١٧٤٧٣٩٩٣٣٣ -ژمارەی پلەکانی ئەولای شوێنی خۆر.

٧×١٢,١٧٤٧٣٩٩٣٣٣ - ٨٥,٢٢٣١٧٩٥٣٣ ژمارەی پلەکانی ئەولای شوێنی خۆر،شوێنی خۆریش لە بەرواره کوردی یەکەوە دەزانین کە ((۲۰))پلە لە بورجی ((۹-کەوان))دایە

٨٥ + ٢٠پلە /٩-کەوان - ٩ پلە /١٢-نەهەنگ ،کەواتە مانگ لە ((٩پلە))نۆ پلەی بورجی ((١٢-نەهەنگ))دایە لە کاتژمێر((٨,١٥))ی سەر لە بەیانی دا چونکە لەو کاتەدا ئەبێ بە ((۷))حەوتی مانگی کۆچی.

دیسانەوە ئەم یاسایەش جگە لە گرفتی خاڵی سێیەم کە پێویستمان بەوەیە بزانین چەندی مانگی کۆچییەو نایزانین ،لە خاڵی دووەمیش دا زۆر سەرکەوتوو نییە چونکە هەرچەندە مانگی کۆچی ((۲۹)) و ((۳۰))مان جیا کردوەتەوە بەڵام نازانین کام مانگ ((۲۹))و کام مانگ ((۳۰))ە ،یان ڕاستتر بڵێین هیچ مانگێکی کۆچی ((۲۹)) یان ((۳۰))ی تەواو نییە بەڵکو هەموو مانگێکی کۆچی لە ڕاستیدا بریتییە لە ((٢٩,٥٣٠٥٨٨٩١٦٦٦٦ ))ڕۆژ و ئەگەر مانگێك بە ((۲۹))دانرا ئەوا زیادەکەی ئەچێتە سەرمانگی داهاتوو بە ((۳۰))حیساب ئەکرێ یان بە واتایەکی تر ئەو مانگە کۆچییەی سەرەتاکەی بە ئێوارە دەست پێدەکات ئەوا بریتی دەبێت لە ((۳۰))سی شەوو ((۲۹))بیست و نۆ ڕۆژ بەڵام ئەو مانگە کۆچییەی بە بەیانی دەست پێدەکات ئەوا ئەبێتە ((۳۰))سی ڕۆژو ((۲۹))بیست و نۆ شەو،جارجارەش ناچار دەبین دوو مانگی دوا بە دوای یەك بە (۳۰) ڕۆژ دابنەین بەڵام هەرگیز

،وومانگی کۆچی دوابەدوای یەك ((٢٩))ڕۆژ نابێت چونکە ماوەی ڕاستەقینەی مانگی کۆچی لە ((٢٩,٥))ڕۆژ زیاترە وەك لە سەرەوە ئاماژەی پێ کرا.

لەبەر ئەوەی ئەم یاسایەش لە دوو ڕووەوە گرفتی دێتە ڕێ ناچار پەنا بۆ ڕێگایەکی تر دەبەین کە بە وردترین شێوە داڕێژراوە و زۆر سەرکەوتووە بەوەش پێویستمان بەوە نابێ کە بزانین چەندی مانگی کۆچی‌یە و کام مانگ((٢٩))و کام مانگ((٣٠))ە و ڕۆژەکانی مانگی کۆچی لە چ کاتژمێرێکەوە دەست پێ‌دەکات بەڵکو ڕاستەوخۆ ڕۆژ بە ڕۆژ لە کاتژمێرێکی دیاریکراودا شوێنەکانی مانگ دەدۆزینەوە و لەویشەوە تێکرای ڕۆژمێری کۆچی دەزانین ،یان بەهۆی یەکێ لە کاتەکانی خۆرگیران و مانگ گیرانەوە سەرجەم ڕۆژمێری کۆچی دیاری دەکەین و لەویشەوە شوێنەکانی مانگ دەدۆزینەوە.

بەم شێوەیە چیتر پێویستمان بەوە نابێ بۆ مانگە کۆچی‌یەکان ڕۆژمێرەکان بە مەزەندە دابنێین و بۆ جەژن و بۆنەکانی تایبەت بە ساڵنامەی کۆچی تەماشای مانگ بکەین یان چاوەڕوانی بڕیاری هەڵەی چەند کەسانێك بکەین تەماشای مانگمان بۆ بکات.

کاریگەری مانگ لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر ئەگۆڕێ‌و کەم و زیاد دەکات لەسەر چەند بنچینەیەك کە ئەمەش کاریگەری خۆی دەبێت لە سەر ڕێژەی سەرکەوتنی ئەزموونی لە دایك بوونی نێرو مێ،کە دەتوانین لە چەند خاڵێك دا کۆیان بکەینەوە

١. بە هەڵاتنی مانگ کاریگەری زیاتر دەبێ بە تایبەتی کاتێ مانگ نزیکەی ((١٥-١٠٠))خولەك بێ هەڵاتبێت .
٢. بە زیادبوونی پڕ((بدر))ی مانگ کاریگەری‌یەکەی زیاتر دەبێت کەلە ((١٤-١٦))ی مانگی کۆچی دەگاتە ئەو پەڕی کاریگەری.
٣. تا مانگ لە ناوەڕاستی بورجەکە نزیکتر بێ کاریگەری زیاتری دەبێت و لە ((١٥))پانزە پلەی بورجەکەدا دەگاتە ئەو پەڕی کاریگەری.

٤. ئەگەر خۆریش لە هەمان ڕەگەزی شوێنی مانگ دابێ واتە ئەگەر مانگ لە بورجێکی مێینەدا بوو وا چاکە خۆریش لە بورجێکی مێینەدا بێت بۆ خولقاندنی کۆرپەلەیەکی مێینە،بە هەمان شێوەش ئەگەر مانگ لە بورجێکی نێرینەدابوو وا چاکە خۆریش لە بورجێکی نێرینەدا بێ بۆ خولقاندنی کۆرپەلەیەکی نێرینە.

٥. خۆر هەڵنەهاتبێت((شەو بێت)).

مەرجیش نی‌یە هەموو ئەم خالآنە ڕەچاو بکرێ بەڵکو ئەو تاقی‌کردنەوانەی ئەنجام دراون هیچ کام لەم خالآنەیان بەهەند وەرنەگرتووە و سەرکەوتنی گەورەشیان وەدەستهێناوە ،بەلآم بۆ زیاتر کاریگەر بوونی مانگ لەو کاتانەدا خستمانە ڕوو و ئەگەر بکرێ چەند خالێك یان هەموویان ڕەچاو بکرێ چاکترە بۆ زیاتر دڵنیا بوون. تاکە خالی زۆر گرنگ کە پێویستە بۆ کاتی جووتبوون ڕەچاو بکرێ،پیتران و نەپیتران یان دڕەنگ و زوو پیترانی هێلکەیە ،چونکە هەموو جارێ لە کاتی جووتبووندا یەکسەر هێلکە ناپیترێ،بەڵکو جاری وایە پیتران دەگاتە نزیکەی شەوو ڕۆژێك دوای جووتبوون بە هۆی ئامادە نەبوونی هێلکەوە یان زۆربەی جار هێلکە هەر ناپیترێ ئەویش بە هۆی مردنی تۆوە وە پێش ئامادە بوونی هێلکە یان بەهۆی مردنی هێلکەوە یاخود بەهۆکاری تر.

هەر چۆنێك بێ گەر هێلکە بپیترێ ،یان لەسەرەتاوە نەپیترێ یاخود ئەوپەڕی دەگاتە نزیکەی شەوو ڕۆژێك دوای کرداری جووتبوون ،لەبەر ئەم هۆکارەش وا چاکە کە کرداری جووتبوون لە نیوەی بورجی دیاریکراو ((بورجی نێرینە یان مێینە))زیاتر تێنەپەڕێت تاکو ئەگەر هێلکە درەنگ پیترا لەناو بورجی دواتردا نەپیترێ و ئەو ڕەگەزەشمان دەست بکەوێ کەمەبەستمانە.

# بنچینەی بەرنامەیەکی
# زانستی وردی مانگ

زەوی لـە مـاوەی ((٣٦٥,٢٤٢١٩٨))ڕۆژ واتـە ((٣٦٥))ڕۆژو ((٥))پێـنج کـاژێرو ((٤٨))خولـەك و ((٤٥,٩٠٧٢))چرکەدا سوڕێکی تـەواو بـە دەوری خۆردا دەکات ،بـەڵام لـە ئەستێرەناسـی دا ئـەبێ بڵـێین یـان گریمـانی ئـەوە بکـەین کـە خـۆرو هەسـارەکان بـەدەوری زەوی دا سـوڕ دەخـۆن ، بۆیـە هـەرکاتێ وتمـان خـۆر یـان هەسارەکان بە دەوری زەوی‌دا گوزەر دەکەن ئەوا تەنها گریمـان و ڕەچاو کردنی جوڵەکانە بە جۆرێکی تر،هەرچی مـانگ ((هـەیڤ))یشـە ئـەوا هـەر لـە ڕاستی‌دا بە دەوری زەوی دا دەسـوڕێتەوە و لەگـەڵ سـوڕانەوەی زەویـش بـە دەوری خـۆردا ئەویش بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە

بەم شێوەیەش سوڕی مانگ و جوڵەی لە بورجێکەوە بۆ بورجێکی تر پەیوەندی بە جوڵەی خۆرەوە دەبێت،ئەگەر خۆر لە چاو زەوی دا پلەیەك ببڕێت لە ماوەی شەوو ڕۆژێك دا ئـەوا مـانگیش لـە هـەمان ئـەو ماوەیـەدا جگـە لـەو چەند پلەیـەی بـەهۆی سوڕانەوەی بە دەوری زەوی دا دەیبڕێت ،یەك پلەی تریش دەبڕێت بە هۆی سوڕی خۆرەوە لە چاو زەوی دا.

پێویستە هەر ڕۆژێك لە جوڵەی خـۆر بەیـەك پلـە دابنـێین،چونکە بەرنامەکە ڕۆژ بە ڕۆژ دادەنێین ،بەم شێوەیەش سوڕێکی ساڵانەی خۆر دەکاتە((٣٦٥,٢٤٢١٩٨))پلـە نـــەك((٣٦٠))پلـــە ،چـــونکە مـــاوەی ســـوڕێکی ســـاڵانەی خـــۆر ((٣٦٥,٢٤٢١٩٨))ڕۆژە،بـەڵام ئەگـەر سوڕێکی خۆرمـان بـە ((٣٦٠))پلـە دانـا ئـەوە ئەبێ هەر ڕۆژێك لە جووڵـەی خـۆر بـە ((٠,٩٨٥٦٤٧٣٣٧٤٩))پلـە دابنـەین [٦]،بەڵام

---

[٦] ژمارەی پلەکانی سوڕێکی خۆر/ژمارەی ڕۆژەکانی سوڕێکی خۆر-٣٦٠/٣٦٥,٢٤٢١٩٨=٠,٩٨٥٦٤٧٣٣٧٤٩ پلە لەماوەی شەوو ڕۆژێك دا.

